# بکوژانی ئابوری

## خوێندنەوەیەک بۆ کتێبی( تیرۆری ئابوریی گەلان )




خوێندنەوەیەك بۆ كتێبی (تیرۆری ئابوریی گەلان- Confessions Of An Economic Hit Man)

د. ئاوات محەمەد ئاغا

نوسەری ئەم كتێبە ناوی (جۆن بێركنز، John Perkins)ە لە ساڵی ١٩٤٥ لەدایكبووە و خەڵكی هانۆڤەرە لە نیو هامشیر سەر بە وڵاتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا، پسپۆڕی ئابوریە و نوسەر و چالاكوانێكی سیاسیی و زانای بواری ژینگەیە، یەكێكە لە و كەسانەی كە هەستاوە بە ئەنجامدانی چەندین كاری تایبەت بۆ وڵاتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا، بەشدار بووە لە چەندین چالاكیی گەورە لە جیهاندا، لە ساڵی ٢٠٠٤ هەموو ئەو كار و چالاكیانەی وەك ددانپیانانێك بڵاوكردەوە لە ژێر ئەو ناونیشانەی سەرەوە. هەروەها لە ساڵی (٢٠٠٧)دا كتێبێكی دیكەی بەناوی (مێژووی نهێنیی ئیمپراتۆریەتی ئەمریكا) بڵاوكردەوە، تیایدا بەدرێژیی باسی هەوڵەكانی ئەمریكا دەكات، كە چۆن دەیەوێت جیهان بكات بە ئیمبراتۆریەك، كە تەنها خۆی خاوەن دەسەڵات بێت تیایدا.

نوسەر بۆ ماوەی بیست ساڵ، نەیدەوێرا ئەو كتێبەی بڵاوبكاتەوە لە ترسی هەڕەشە، لە سەرەتای هەشتاكاندا بەرتیلێكی زۆری وەرگرت لە بەرانبەر ئەوەی كە بێدەنگ بێت، بەڵام دوای ڕوداوی یازدەی سێپتەمبەر بڕیاریدا كە كتێبەكەی بڵاوبكاتەوە، بێ گوێدانە ئاكامەكەی، لە ساڵی ٢٠٠٤ دەزگایەك توانیی بڵاویبكاتەوە و دواتر وەرگێڕدرا بۆ سەر سی زمانی بیانیی.

پوختەی كتێبەكە بریتییە لە تیشكخستنەسەر كار و چالاكیی ئەو كۆمەڵە لە پیاوانی بازرگانیی و سیاسەت لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، كە دەیانەوێت ئیمپراتۆریەكی جیهانیی دروستبكەن، كە

چینی کۆرپۆرکراتی دەستی بەسەردا بگرێت، واتا لە ژێر دەسەڵاتی کۆمپانیا زەبەلاحەکان کە دەستیان بەسەر ئابوریی جیهاندا گرتووە. ئەمەیش پێچەوانەی شێوازی ئیمپریالیی کۆنە، کە لە سەرەتادا هێرشی سەربازیی بەکاردەهێنرا، بەڵام لەم شێوازە نوێیە لە سەرەتادا هێرشی سەربازیی بەکارناهێنرێ. هەر بۆیە دەڵێت کاتێك کە لە ئیشەکەماندا شکستخواردوو دەبوین، کۆمەڵێکی دیکە دەهاتنە پێشەوە بۆ تەواوکردنی کارەکامان، کە پێیاندەوترا (رێوییەکانی دەزگای هەواڵگریی ناوەندیی ئەمریکا) یاخود جاکلز، بە لەناوبردنی سەرۆکەکە وەك ئەوەی لە وڵاتی پەنەما و ئیکوادۆر، یاخود بە کودەتاکردن بەسەریدا وەك ئێران، یاخود بە هێرشی سەربازیی وەك عێراق.

نوسەر کە پسپۆرێکی ئابورییە، رۆڵی بکوژی بە کرێگیراوی بینیوە بۆ کۆمپانیای راوێژی ئەندازیاریی لە نێوان ساڵانی ١٩٧١- ١٩٨١، بۆ ماوەی دە ساڵ لەو بوارەدا کاریکردووە، دوای ئەوەی چەندین تاقیکردنەوەی لێهاتویی بڕیوە، کە لەلایەن ئاژانسی ئاسایشی نیشتیمانیی ئەمریکیەوە (NSA) ئامادە کرابوو.

لەو ماوەیەدا نوسەر لەگەڵ کۆمەڵێك پسپۆڕ و شارەزا لە بوارەکەی خۆیاندا کاریانکردووە بۆ کۆمپانیا گەورە و زەبەلاحەکانی ئەمریکا، رۆڵیان بریتیبووە لە روخاندنی ژێرخانی ئابوریی وڵاتانی جیهانی سێهەم، ئەویش بە رازیکردنی سەرکردەی ئەو وڵاتانە بە وەرگرتنی قەرز، بەمەبەستی ئاوەدانکردنەوە و پێشخستنی وڵات. رۆڵی سەرەکیی نوسەر وەك خۆی دەڵێت بریتیبووە لە "رازیکردنی سەرۆك و کاربەدەستانی جیهان بە وەرگرتنی قەرز، پاشان بە ئاسانی دەتوانین بەکاریانبهێنین، چۆن و کەی ویستمان بۆ بەدەستهێنانی پێداویستییە سیاسیی و ئابوریی و سەربازییەکامان".

لە راستیدا ئەو وڵاتانەیش لە توانایاندا نییە ئەو قەرزانە بدەنەوە، بۆیە ناچاردەبن بکەونە ژێر کاریگەریی ئەو کۆمپانیا قۆرخکارانەوە، ئەوانیش بە ئارەزوی خۆیان فەرمانیان بەسەردا دەسەپێنن، بۆ نمونە پێویستی دەکەن لەسەریان کە نەوت بە نرخێکی کەم بفرۆشن بە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، یاخود فرۆشتنی ژێرخان و دامودەزگاکان بە کەرتی تایبەت و کۆمپانیا ئەمریکییەکان، یاخود ناچارکردنیان بە کردنەوەی بنکەی سەربازیی لە وڵاتەکەیاندا، یاخود ناردنی سوپا و هێزی چەکدارییان بۆ ئەو وڵاتەی کە واشنتۆن دەیەوێ.







**» ئەو وڵاتانەی کە لە توانایاندا نییە ئەو قەرزانە بدەنەوە، ناچاردەبن بکەونە ژێر کاریگەریی ئەو کۆمپانیا قۆرخکارانەوە، ئەوانیش بە ئارەزوی خۆیان فەرمانیان بەسەردا دەسەپێنن**

نوسەر باس لەو رێوشوێنانە دەکات، کە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بەکاریاندەهێنن لەگەڵ جیهانی سێهەمدا. هەروەها باسی هەڵوێستی ئەمریکا دەکات سەبارەت بە سیستەمی ئەو ناوچەیە، لە کۆن و لە ئێستادا. چەندین ئاماژە و هێمایش لەخۆدەگرن و یارمەتیدەرن بۆ تێگەیشتن لە هەڵوێستی واشتنۆن و سیاسەتی دەستتێوەردانی لە ناوچەکەدا.

ئەم کارانە هەمووی بە نهێنیی ئەنجامدەدران لە لایەن بێرکنز و هاوەڵەکانیەوە وەك لینکێك لە نێوان بانکی نێودەوڵەتیی و سندوقی دراوی جیهانیی و وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا و کۆمپانیا قۆرخکارە زەبەلاحەکان و حکومەتەکانی وڵاتانی ئەفریقا و ئاسیا و ئەمریکای لاتین و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

**چۆن گەلان لە روی ئابوریەوە لەناودەبەن؟**

سەرەتا پسپۆرانی بکوژە ئابورییەکان لە کۆمپانیا راوێژکارییە ئەمریکییەکان هەڵدەستن بە دیاریکردنی وڵاتێك، کە خاوەن داهاتێکی باش بێت وەك نەوت، راپۆرتێکی لەسەر دەنوسن و پاشان داوا لە سەرانی ئەو وڵاتە دەکەن، کە داوای قەرز لە سندوقی دراوی جیهانیی و بانکی نێودەوڵەتیی و دامەزراوە داراییە نێودەوڵەتیی و ئەمریکییەکان بکەن، بە مەبەستی بوژانەوەی ئابوریی، بەپێی ئەو راپۆرتەی کە پێشتر ئامادەیانکردووە، بە شێوەیەك کە زیادەڕەویی تێدا دەکرێت بە مەبەستی چەواشەکاریی و هەڵخەڵەتاندنیان، بۆ ئەوەی بچنە ژێر باری قەرزەوە، لە لایەکی تریشەوە بەرپرس و کاربەدەستان تێوەدەگلێنن، بەوەی کە پشکی زۆریان دەبێت لە داهاتوودا، ئەگەر بەگوێیانبکەن، رێکخراوە داراییەکانیش رازیدەبن بە پێدانی قەرز بە مەبەستی ئاوەدانکردنەوە و دروستکردن و چاککردنی رێگەوبان و دانانی وێستگەی بەرهەمهێنانی کارەبا و دامەزراندنی کارگە و چەندین پرۆژەی دیکەی زیندوو، بەڵام بەمەرجێك دەبێت لەلایەن نوسینکەی ئەندازیاریی و کۆمپانیا بەڵێندەرەکانی ئەمریکاوە جێبەجێبکرێن، بەم شێوەیە ئەو قەرزە دەچێتە



## » بکوژانی ئابوریی ئەو وڵاتانە هەڵدەبژێرن، کە لە ڕوی داهاتەوە دەوڵەمەندن

بانکەکانی ئەمریکاوە، بەم شێوەیە و چەندین شێوازی تر ئەمریکا ڕۆژ بە ڕۆژ دەستکەوتی زیاتری دەبێت لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکاندا، پاشان داوا لەو وڵاتانە دەکات، کە بە نرخێکی هەرزان نەوت بفرۆشن بە کۆمپانیا ئەمریکییەکان و ڕێگەبدەن بە کردنەوەی بنکەی سەربازیی لە وڵاتەکانیان، یاخود بەشدار بن لەو جەنگەی کە ئەمریکا هەڵیدەگیرسێنێت، یاخود دەبێت دەنگبدەن لەسەر ئەوەی ئەمریکا دەیەوێت لە نەتەوە یەکگرتووەکان، لەوەیش زیاتر سوکایەتیپێکردنیان بەوەی، کە دەبێت هەندێك کۆمپانیا بکرێن بە کەرتی تایبەت و بدرێن بە کۆمپانیاکانی خۆیان، بۆ ئەوەی دەست بەسەر داهاتی وڵاتدا بگرن، هەر بەربەستێك بێتە ڕێیان خێرا (CIA) دێتە پێشەوە و هەوڵی کوشتن و لەناوبردنی سەرۆکی وڵات دەدات، یاخود کودەتای بەسەردا دەکات، یاخود هێرشی ڕاگەیاندن و سەربازیی دەکاتە سەر تا ڕادەستیدەبێت، لە پاشاندا هەموو ئەو کارانە بە ئەرکێکی نیشتیمانیی پیرۆزی دەزانن.

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە جیهانی سێهەم چینایەتیی دروستدەبێت و لە نێوان هەژار و دەوڵەمەند کەلێن دروستدەبێت، چونکە قورسیی و گرانیی ئەو قەرزە وا دەکات کە چینی هەژاران بۆ ماوەیەکی زۆر بێ بەش بن لە خزمەتگوزاری گشتیی، بەڵام چینی دەوڵەمەند، کە زۆربەیان خاوەنی نفوزێکی سیاسیی و ئابورین لە ناو دەوڵەتدا هیچ کاریگەرییەکی ترسناکیان لەسەر نییە، هەروەها ڕێژەی ئەو قەرزەی کە لای وڵاتانی جیهانی سێهەمە نزیکەی ٢,٥ دوو تریلیۆن نیو دۆلارە.

نوسەر نمونەی هەندێك لەو وڵاتانە دەهێنێتەوە، کە کارو چالاکیان تێدا ئەنداماوە:

١- وڵاتی ئێران یەکەم وڵات بووە، کە بوونەتە قوربانیی دەستی بکوژە ئابورییەکان:

کاتێك کە محەمەد موسەدەق لە پۆستەکەی لە






ساڵانی پەنجاکانی سەدەی ڕابوردوو لەنێوات ساڵانی (١٩٥١-١٩٥٣) وەك سەرۆك کۆماری ئێران دەستبەکاربوو، ویستی بەرهەمی نەوت خۆماڵی بکات (تامیم)، ئەو کۆمپانیا بەریتانەیەیشی ئاگادارکردەوە ئەگەر دەیەوێت نەوت پاڵفتە بکات، ئەوە دەبێت پشکێکی زۆر بدات بە ئێران لە داهاتی نەوت، ئەمریکا ترسی ئەوەی هەبوو کە موسەدەق پاڵپشتی زۆر ببێ لە ناوچەکەو پەیوەندیی بەهێز ببێ لە گەڵ وڵاتی ڕوسیا، بەڵام ئەمریکا نەیدەتوانی بە هێزی سەربازی موسەدەق لەناوبەرێت، بەڵکو هەستا بەناردنی سیخوڕێك بەناوی (کیرمیت ڕۆزفلت) بۆ ئێران، ناوبراو توانیی چەند کەسێك بە پارە لە خۆێ کۆبکاتەوە و پاشان هەستان بە ڕێپێوان لە دژی موسەدەق بەڵام لەبەرئەوەی ژمارەیان کەم بوو نەیانتوانی موسەدەق لابەرن لە دەسـەڵات، ناچار پەنایانبردە بەر کودەتا و موسەدەقیان دەستبەسەرکرد و جارێکی دیکە شایان هێنایەوە سەر دەسـەڵات، بەم شێوەیە یەکەم ئەزمونی کوشتنی ئابوریی بە سەرکەوتوویی و بە ئاسانیی ئەنجامدرا.

٢- وڵاتی گواتیمالا: وڵاتی گواتیمالا بوو بە گەمەی دەستی کۆمپانیای یەکگرتووی میوە (شرکة الفاكهة المتحدة) و چەند کۆمپانیایەکی زەبەلاحی نێودەوڵەتی.





لە ساڵانی پەنجاکاندا (ئەربنز) خاوەنی ئەو وتەیە بوو کە دەڵێت "دەمانەوێ زەوی بگەڕێنینەوە بۆ خەڵکی"، لە ڕێگەی هەڵبژاردنێکی ئازادەوە بۆ یەکەم جار بە سەرۆکی ئەو وڵاتە هەڵبژێردرا، هەر لەگەڵ دەستبەکاربونی ئەو سیاسەتەی ڕاگەیاند کە دەبێ مافی خاوەنێتیی زەوی و زار بدرێتەوە بە خاوەنەکانیان، چاکسازی کشتوکاڵیی ڕاگەیاند، هەموو ئەم سیاسەتانە جێی مەترسیی بوون لەسەر کۆمپانیای (یونایتد فرود)، چونکە (ئەربنز) دەیویست وڵات لە چنگی دەرەوە دەربهێنێت و هەژمونی دەرەوە هەڵبگرێت لەسەر وڵاتەکەی، هەر بۆیە ڕاگەیاندنی ئەمریکا هەستا بە هێرشکردنە سەری بە بڵاوکردنەوەی پروپاگەندە، بە بیانوی ئەوەی کە ئەو وڵاتە هاوەڵی سۆڤیەتە و دژی ئەمریکا پلاندەگێڕن، ساڵی ١٩٥٤ (CIA) لە پلانێکدا توانییان بە کودەتایەك ئەو سەرۆکە هەڵبژێردراوە بگۆڕن بە سەرۆکێکی دیکتاتۆر بەناوی (کارلۆس ئەرماس)، ناوبراو لەگەڵ دەستبەکاربونی خێرا هەرچی سیاسەتی چاکسازیی کشتوکاڵی و باج هەبوو لەسەر وەبەرهێنەرە بیانییەکان هەمووی هەڵوەشاندەوە، وڵاتی جارێکی دیکە خستەوە ژێر هەژمونی ئەمریکا، هەرچی نەیاری هەبوو هەموی خستنە بەندیخانەوە.

٣- وڵاتی ئیکوادۆر: بکوژانی ئابوریی، وڵاتی ئیکوادۆریان بەرەو مایەپوچیی برد بەمەبەستی ئەوەی دەست بەسەر دارستانی ئەمازۆندا بگرن، کە یەدەکی نەوتی زۆری تێدایە، بە ئەندازەی ئەوەی کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا هەیە، توانییان لە ماوەی سی (٣٠) ساڵدا ئاستی هەژاری لە ٥٠٪ بۆ ٧٠٪ بەرز بکنەوە، ئاستی بێکاریی لە ١٥٪ بەرز بوەوە بۆ ٧٠٪، قەرزی گشتیی لە ٢٤٠ ملیۆن دۆلارەوە بەرزبوەوە بۆ ١٦ ملیار دۆلار، ناچار هەستا بە دابینکردنی ٥٠٪ی داهاتی بۆ دانەوەی قەرز، تەنها چارەیەکیش لەبەردەم ئەو وڵاتەدا بریتیبوو لە فرۆشتنی دارستانەکانی ئەمازۆن بە کۆمپانیا ئەمریکییەکان، بۆ ئەوەی بتوانێت قەرزەکانی پێبداتەوە، بەو شێوەیە ڕێککەوتن، کە دەبێ لە هەر ١٠٠ دۆلار لە داهاتی ئەو نەوتە خاوەی، کە دەردەهێنرێت، دەبێت ٧٥٪ بۆ کۆمپانیا ئەمریکییەکان بێت و لە ٢٥٪ی بۆ ئیکوادۆر بێت، لە بەشی ئیکوادۆر نزیکەی ٧٥٪ دەچوو بۆ دانەوەی قەرز و خەرجیی حکومەت، ئەوەی کە دەمایەوە تەنها ٢,٥ دۆلار بۆ تەندروستی و فێرکردن و کەرتەکانی دیکەی خزمەتگوزاری تایبەت بە هەژاران.

وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، وڵاتی ئیکوادۆر لەژێر دەسەڵاتی کۆمپانیا ئەمریکییەکاندا بوو، تا ئەو کاتەی لە هەڵبژاردنێکدا (ڕاڵدۆس) بە ڕێژەیەکی چاوەڕواننەکراو زۆرینەی دەنگی بەدەستهێنا، کە لە مێژووی ئەو وڵاتەدا ڕوینەدابوو، ناوبراو زۆر گرنگیی بە هەژاران دەدا، چەندین بڕیاری لە بەرژەوەندیی گەل دەرکرد، لەوانە؛ بڕیاریدا بەوەی کە داهاتی نەوت دەبێ بگەڕێتەوە بۆ گەل، هەر بۆیە بڕیاریدا کە





هەژمونی ئەمریکا لەسەر نەوتی وڵاتەکەی نەهێڵێت، یاسای (هـایـدرۆکـاربـۆن)ی دەرکـرد، ئـەو یاسایە ڕێکخەری دۆزینەوە و فرۆشتنی نەوت بوو. پەیمانگای (SIL)ی بەوە تاوانبارکرد کە خەریکی پیلانگێڕانن لەگەڵ کۆمپانیاکانی دیکەی نەوت، بۆیە هەمویانی لە وڵات دەرکرد، هەموو ئەو کۆمپانیا بیانییانەی بە تایبەت کۆمپانیاکانی نەوتی ئاگادارکردەوە لەوەی کە ئەگەر بێت و پلانێك دانەنێن بۆ یارمەتیی و هاریکاریکردنی ئیکوادۆر، ئـەوە پێویستە وڵات جێبهێڵن، بەڵام ئیمپراتۆریەتی ئەمریکیی نیگەران بوو بەم هەڵسوکەوتە ئازادیخوازانەی ڕاڵـدۆس، بۆیە لە سەرەتادا بکوژە ئابورییەکانی نارده لای بۆ ئەوەی دانوستاندنی لەگەڵ بکەن، هەوڵیاندا بەوەی کە ڕازییکەن واز لەو هەڵوێست و بڕیارانەی بهێنێت، جارێك بە قسەی خۆش و جارێکیش بە هەڕەشەی کوشتن و دورخستنەوەی لە پۆستەکەی، بەڵام بێهیوابوون لە هەوڵەکانیان، بۆیە دواجار بە ڕوداوی فڕۆکە تیرۆریانکرد، پاشان نەیانهێشت کەس لەو شوێنە نزیکببێتەوە جگە لە هێزێك لە سوپای ئەمریکیی، کە لە بنکەیەك بوون لەو شوێنە لەگەڵ سوپای ئیکوادۆر، دوو کەسیش کە شایەتحاڵی ڕوداوەکـە بـوون بە ڕوداوی هاتوچۆ لەناوبران، پێش ئەوەی شایەتییدەن لەسەر ڕوداوەکە.

٤- وڵاتی پەنەما: عومەر تۆریخۆسی سەرۆکی ئەو وڵاتە دۆستی هەژاران بوو، حەزیدەکرد وڵاتەکەی ڕزگاربکات و قەناتی پەنەما بگەڕێنێتەوە بۆ دەستی گەل، هەروەها هەوڵیدا هاریکاریی وڵاتانی ئەمریکای لاتین بکات بۆ ئەوەی سەربەخۆیی بەدەستبهێنن، توانیی لـەڕێـی پەیمانێکەوە کـە لـە کۆنگرێس دەنگی لەسەر درا، قەناتی پەنەما بگەڕێنێتەوە ژێر دەسـەڵاتـی گـەل، هـەروەهـا هەستا بەدەرکردنی پەیمانگەی هاوینەی بۆ زمانەکان، زۆر بە توندیی ئـەوەی ڕەتـکـردەوە کە ڕادەستی داواکارییەکانی ئیدارەی ڕیگن بێت سەبارەت بە وەی کە سەر لەنوێ دانوستاندن بکەن لەسەر پەیمانی قەنات، لە وەڵامیدا بۆ بێرکنز، کە دەیویست بە بەرتیل ڕازییبکات واز لە پرۆژەکانی بهێنێت. گوتی "پێویستم بە سەروەت و سامان نییە. ئەوەی مەبەستمە ئەوەیە کە دادپەروەرانە مامەڵە لەگەڵ گەلەکەم بکەم و بتوانن قەناتی پەنەما بگەڕێننەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، بیشتوانین ئەو قەرزانە بدەینەوە کە ئێمەتان خستوەتە ژێرباری بۆ ئەوەی ئەو کاولکاریی و وێرانییەی پێ باشبکەین کە ئێوە کردتان، بۆیە هەوڵمەدە بمکڕیت". عومەر خاوو خێزانی کۆکردەوە وە ئاگاداری کردن بەوەی کە وا هەست دەکات پاش تیرۆر کردنی سەرۆکی ئیکوادر سەرەی ئەو دێ، بەڵام زۆر لە هەڕەشە نەدەترسا چونکە دەیوت خەونەکانم هاتنە دی، بەڵام پاش دوو مانگ بەهەمان شێوەی سەرۆکی ئیکوادۆر ڕاڵدۆس ئەویش لە ڕوداوێکی فڕۆکەدا تیرۆر کرا.

دوای تیرۆرکردنی عومەر تۆریخۆس، نوریێگا دەسەڵاتی گرتەدەست، ئەویش دۆست و لایەنگری



هەژاران بوو، لە گرنگترین پرۆژەكانی ئەوەبوو كە بتوانێت قەناتێكی دیكە لە ڕێی كۆمپانیا یابانییەكانەوە دروستبكات، كە ئەمە دەبــووە هــۆی ئــەوەی كە كۆمپانیا ئەمریكییەكان كاری نوێ لەدەستبدەن لەو وڵاتە، هەروەها ڕازینەبوو كە بۆ ماوەی پازدە ساڵی دیكە كاری قوتابخانە ئەمریكییەكان درێژبكاتەوە، ئەگەر چی ئەم هەموو كارانەی كرد، بەڵام وەكو سەرۆكی پێشوو (عومەر) دادپــەروەر و دەستپاك نەبوو، لە كۆتاییدا نازناوی خرابی دەركــرد و بە گەندەڵ ناسرا و تۆمەتباركرا بەوەی كە بازرگانیی مادە هۆشبەرەكان دەكات، سەرۆك بۆش ئەوەی بە هەل زانی بۆ هێرشكردنە سەر پەنەما، بەمەبەستی ڕاوەدونانی ئەو سەرۆكە، سەربازە ئەمریكییەكان هەستان بە كاولكردنی ناوچەیەكی گەورە لە پایتەخت و ژمارەیەكی زۆر لە هاووڵاتیان كوژران و نزیكەی بیست و پێنج هەزاریش ئـاوارە بوون، لە كۆتاییدا توانییان نورییگا بە دیلیی بیگرن و بە چڵ ساڵ زیندانیی سزایان بەسەردا سەپاند.

٥- وڵاتی ڤەنزوێلا: شافیز دەسەڵاتی گرتەدەست و دەستیكرد بە بەرەنگاریی ئـیدارەی ئەمریكا، بەڵام لەو كاتەدا ئەمریكا سەرقاڵی پلاندانان بوو بۆ داگیركردنی عێراق و ڤەنزوێلا، بەڵام نەیدەتوانی خۆی بۆ دوو جەنگ ئامادەبكات لەیەك كاتدا، بۆیە هێرشی سەربازیی كردە سەر عێراق. سەبارەت بە ڤەنزوێلا هەوڵیدا كە هەمان ئۆپراسیۆن بەكاربهێنێت، كە لەگەڵ موسەدەقی سەرۆكی ئێران بەكاریهێنا، لە ساڵی ٢٠٠٢ پیاوانی (CIA) ژێربەژێر هەستان پەیوەندییان بە چەندین سەربازیی پلە بەرزەوە كرد، كە بەرانبەر بـە پـارەیـەكـی خـەیاڵی هەستن بـە ئەنجامدانی كودەتایەك، لەهەمان كاتدا كرێكارو فەرمانبەرەكانیان هاندا هەستن بە مانگرتن و ڕێپێوان، كودەتا كرا بەسەر شافێزدا، بەڵام ئەوەی چاوەڕواننەدەكرا ئەوەبوو، كە شافێز توانیی لە ماوەی حەفتاو دوو كاتژمێردا كۆتایی بە دەسەڵاتی كودەتاچییەكان بهێنێت و بگەڕێتەوە دەسەڵات.

٥- وڵاتی عێراق: وڵاتی عێراق بە شێوەیەكی جیاواز تیرۆركرا، دوای ئەوەی كە بكوژانی ئابوریی نەیانتوانی سەدام ڕازیبكەن بە بەرتیل، (CIA)یش شكستیهێنا لە لابردنی و كودەتا بەسەریدا، بۆیە پەنایانبردە بەر هێرشی سەربازیی، چەندین هێرشی ئاسمانیی و زەمینیی كرایەسەر، لەو هێرشانەدا

» هەر وڵاتێك لە جیهانی سێدا دەوڵەمەند بێت، ئەمریكا هەوڵی بڵاوكردنەوەی گەندەڵیی تێدا دەدات، خۆ ئەگەر سەرۆكێكی دڵسۆزی هەبێت و مل بە داواكانیان نەدات، یان تیرۆریدەكەن، یان لە ڕێی كودەتاوە لایدەبەن





## » بکوژانی ئابوریی نەیانتوانی سەدام ڕازیبکەن بە بەرتیل، (CIA)یش شکستیهێنا لە لابردنی و کودەتا بەسەریدا، بۆیە پەنایانبردە بەر هێرشی سەربازیی

چەندین کەس تیاچوون، هەر بۆیە ئەو شەڕە لەلایەن هەندێك لە نوسەرانەوە بە جەنگی پترۆ دۆلار ناودەبرا، لە کۆتاییدا ئەو ڕژێمە لە ناوبرا، بەڵام پاش کاولبون و وێرانیی، دواتر دەستکرا بە نۆژەنکردنەوە و دروستکردنەوەی سەرلەنوێ لەلایەن کۆمپانیا ئەمریکییەکانەوە. بەم شێوەیە دەستیانگرت بە سەر نەوت و چەندین پلانی نۆژەنکردنەوە لە بەرژەوەندیی خۆیاندا.

٧- وڵاتی سعودیە: لە ١٩ی ئۆکتۆبەردا نیکسۆنی سەرۆکی پێشوی ئەمریکا داوای لە کۆنگرێس کرد، کە بە بڕی ٢,٢ ملیار دۆلار پاڵپشتی ئیسرائیل بکرێت، سعودیە و چەند وڵاتێکی دیکەی عەرەبی هەستان بە قەدەغەکردنی هەموو ئەو کەشتیی و پاپۆڕانەی، کە نەوت دەگەیێننە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بۆ ماوەیەکی کاتی و لە ١٨ی مارسی ١٩٧٤دا، کاری کەشتییەکان ئاسایی بووەوە، بەڵام نرخی نەوت لە ١,٣٩ دۆلارەوە بەرزبووەوە بۆ ٨,٣٢ دۆلار بۆ هەر بەرمیلێك، ئەمریکا هەستا بە دانوستاندن لەگەڵ سعودیە و ڕێککەوتن لەسەر دامەزراندنی ئاژانسی گەشە، کە لە لیژنەیەکی ئەمریکیی و سعودیی پێکهاتبوون بۆ هاریکاریی ئابوریی، ئەو لیژنەیە لەژێر چاودێریی وەزارەتی داراییی ئەمریکیدا بوو، ئەو لیژنەیە داوای لە بکوژانی ئابوریی کرد، کە چەند ڕاپۆرتێك ئامادەبکەن لەسەر ئەوەی چۆن بتوانن بە سەدەها ملیۆن دۆلار زیان لە ئابوریی سعودیە بدەن و بە فیڕۆیبدەن، مەبەستیان نەبوو ئەو وڵاتە بخەنە ژێر قەرزەوە، بەڵکو مەبەستیان ئەوەبوو هەقی ئەوە بکەنەوە، کە بەهۆی قەدەغەکردنی کەشتییە بارهەڵگرەکانی نەوتەوە ئەمریکا چەند زیانی بەرکەوتووە، هەموو ئەو زیانانە بگەڕێنێتەوە بۆ کۆمپانیاکانی خۆی، لەو کاتەدا وڵاتی سعودیە لەڕوی خزمەتگوزارییەوە زۆر کەمتەرخەم بوو، بۆیە ڕاوێژکاران چەندین پرۆژەیان پێشکەشکرد، لەو کاتەدا بۆ لەناوبردنی خۆڵوخاشاك مەروماڵاتیان دەخستە سەری وەك لەوەڕگا، ڕاوێژکارە ئەمریکییەکان ئەوەیان بە هەل قۆستەوە، کە چۆن دەبێت لە سەدەی بیستدا وڵاتێك هەبێت بەم شێوازە خۆڵوخاشاك لەناوبەرێت؟ بۆیە گوتیان پێویستە کۆمپانیا ئەمریکییەکان هەستن بە کۆکردنەوەی خۆڵوخاشاك و دەبێت کرێکارەکانیش خەڵکی سعودیە نەبن، کە ئەوانیش پێویستیان بە شوێنی مانەوە و نەخۆشخانە و بازاڕ و چەندین پێداویستیی دیکە هەیە، هەروەها پرۆژەی دامەزراوەکانی بەرهەمهێنانی نەوت، کە پێویستی بە دامەزراندنی کۆمەڵگەیەك بوو بۆ بەرهەمهێنانی پترۆکیماویی، ئەویش پێویستی بە ناوچەیەکی پیشەسازیی و ئاوەدانیی گەورەی دەکرد، هەروەها وێستگەی بەرهەمهێنانی کارەبا و هێڵی گواستنەوە و گەیاندن و دابەشکردن، هێڵی گواستنەوەی نەوت و فڕۆکەخانە و چەندین پرۆژەی دیکە، کە ڕاوێژکاران یاخود بکوژانی ئابوریی خستیانە بەردەم حکومەتی ئەمریکی بە خەرجییەکی خەیاڵی، حکومەتی سعودیی بەڵێنی بە ئەمریکا دا، کە پابەندبێت بە هەموو ئەو بەڵێنانەوە و نەوت بە نرخێکی تایبەت بفرۆشێت بە ئەمریکا لە بەرانبەر هێشتنەوەیان لە دەسەڵات و پاراستنیان لە کاتی پێویستدا و هاوکاریکردنیان لە ڕوی سیاسیی و سەربازییەوە.

لێرەدا پرسیارێك دێتەپێشەوە؛ ئایا ڕێتێناچێت کەمکردنەوەی موچەی فەرمانبەران و دروستکردنی قەیرانی دارایی لە هەرێمی کوردستان بەشێك بێت لە پرۆژەکەی بکوژانی ئابوریی؟